ناڤ ________ بەروار ________ هۆبە ________

## راهێنان

وانەیا **2-6**

### زنجیرە *Series*

**هەر زنجیرەکێ بکارئینانا هێمایێ سەرجەمی بنڤیسە:-**

**1** $-2+4-8+16-32$ ________

**2** $\frac{1}{10}+\frac{1}{100}+\frac{1}{1\,000}+\frac{1}{10\,000}$ ________

**3** $-6-1+4+9+14+19$ ________

**4** $\frac{1}{3}+\frac{1}{6}+\frac{1}{9}+\frac{1}{12}+\frac{1}{15}+\frac{1}{18}$ ________

**5** $7+13+19+25+31$ ________

**6** $-1+1-1+1-1+1-1$ ________

**هەر زنجیرەکێ ڤەکە، پاشی سەرجەمی بهەژمێرە.**

**7** $\sum_{k=4}^{8}\frac{k}{4}$

أ ڤەکە. ________

ب سەرجەمی بهەژمێرە. ________

**8** $\sum_{k=1}^{4}5^{k-2}$

أ ڤەکە. ________

ب سەرجەمی بهەژمێرە. ________

**9** $\sum_{k=2}^{6}(-2^{k})$

أ ڤەکە. ________

ب سەرجەمی بهەژمێرە. ________

**10** $\sum_{k=30}^{39}(70-2k)$

أ ڤەکە. ________

ب سەرجەمی بهەژمێرە. ________

**سەرجەمێ هەر زنجیرەیەکێ بهەژمێرە.**

**11** $\sum_{k=12}^{20}3$ ________

**12** $\sum_{k=1}^{40}k$ ________

**13** $\sum_{k=1}^{10}k^{2}$ ________

**شیکاربکە.**

**14** زەکەریا یانەیەکا ئینتەرنیتێ دروستکر و دوو هەڤالێن خو رازیکرن ژ بۆ پشکداریێ دیانەیێدا بکەن. ل رۆژا دووێ هەر ئەندامەکی دوو هەڤالێن خۆ رازیکرن ژ بۆ بەشداریێ ل یانەیێ بکەن، ل رۆژا سێیێ هەر ئەندامەکی دوو هەڤالێن خو رازیکرن ژ بۆ بەشداریکرنێ ل یانەیێ، و ب ئەڤی شێوەی بەردەوامبوون ل ماوەیێ حەفتیەکا تمام.

أ زنجیرەکێ بنڤیسە ژمارا ئەندامێن یانەیێ بنوێنیت ل دوماهیا $n$ رۆژان. ________

ب زنجیرەیەکێ بنڤیسە ژمارا ئەندامێن یانەیێ بنوێنیت ل دوماهیا حەفتیا ئێکێ. ________

ج ژمارا ئەندامێن یانەیێ دێ بنە چەند هەتا دوماهیا حەفتیا ئێکێ؟ ________

ناڤ ________ بەروار ________ هۆبە ________

# ڕاهێنان

وانەیا 3-6

## ئێك ل دووڤ ئێك و زنجیرەییێن ژمارەیی

*Arithmetic Progressions (Sequences) and Series*

**دیاربکە، ئەرێ هەر ئێك ل دووڤ ئێكەك یا ژمارەییە یان نە. بنچینە و دانەیێ ل دووڤ دیاربکە:-**

**1** 41 ; 24 ; 7 ; -10 ; -27 ; ...

**2** 6 ; -6 ; 6 ; -6 ; 6 ; -6 ; 6 ; -6 ; ...

**3** $\frac{4}{5}$ ; $\frac{13}{10}$ ; $\frac{9}{5}$ ; $\frac{23}{10}$ ; $\frac{14}{5}$ ...

**4** 2 ;4 ; 8 ; 16 ; 32 ; 64 ; ...

**ڕادەیێ دووازدێ ل ئەڤێ ئێك ل دووڤ ئێكا ژمارەییێ بهەژمێرە.**

**5** 21 ; 32 ; 43 ; 54 ; 65 ; ...

**6** 3.7 ; 3.3 ; 2.9 ; 2.5 ; 2.1 ; ...

**7** 1.8 ; -1.1 ; -4 ; -6.9 ; -9.8 ; ...

**8** -8 ; -2.75 ; 2.5 ; 7.75 ; 13 ; ...

**ڕادەیێ نەدیار ل ئەڤێ ئێك ل دووڤ ئێكا ژمارەیی بهەژمێرە.**

**9** 59 ؛ ____ ؛ ____ ؛ ____ ؛ 3 ؛ ...

**10** 23 ؛ ____ ؛ ____ ؛ −4 ؛ ...

**11** 62 ؛ ____ ؛ ____ ؛ ____ ؛ 7 ؛ ...

**12** −7 ؛ ____ ؛ ____ ؛ ____ ؛ ____ ؛ ____ ؛ ____ ؛ ____ ؛ 35 ؛ ...

**ڕادەیێ دەهێ ل ئەڤێ ئێك ل دووڤ ئێكا ژمارەیی بهەژمێرە:**

**13** $a_4 = 12$ و $a_7 = 20.4$

**14** $a_3 = 37$ و $a_{17} = -12$

**15** $a_{13} = -5$ و $a_{18} = -51$

**16** $a_{25} = 18$ و $a_{41} = 62$

**شیکاربکە.**

**17** هۆلا خوارنگەهەکێ جۆرەکی مێزان تێدایە، جهێ چوار کەسان ل دۆر هەیە، جهێ هەر کەسەکی ل رەخەکی. ل دەمێ ئاهنگ گێرانێ، ئەوان مێزان بتەنیشت ئێکودوو ڤە رێزدکەن ب شێوێ رێزەکا درێژ، کو هەر دوو مێزان جهێ شەش کەسان ل دۆر هەبیت و هەرسێ مێزان جهێ 8 کەسان ل دۆر هەبیت، و هەر 4 مێزان جهێ 10 کەسان ل دۆر هەبیت. چەند مێزان دڤێت پێکڤە رێزبکەن بۆ وەرگرتنا 40 کەسان؟

ناڤ ________ بەروار ________ هۆبە ________

# ڕاهێنان

وانەیا **4-6**

## ئێك ل دووڤ ئێك و زنجیرەیێن ئەندازەیی
*Geometric Progressions (Sequences) and Series*

**جۆرێ ئێك ل دووڤ ئێکێ دیاربکە، ئەرێ ئەندازەییە، یان ژمارەییە، یان هیچ جۆرەك ژ وانە نینە، هەکەر یا ئەندازەیێ بوو یان ژمارەیی بوو، بنچینەیێ وێ دیاربکە:-**

**1** 1.1 ; -3.3 ; 9.9 ; -29.7 ; 89.1 ; ...

**2** -18 ; -7 ; 4 ; 15 ; 26 ; ...

**3** 1 ; 2 ; 6 ; 24 ; 720 ; 120 ; ...

**4** 3125 ; 2500 ; 2000 ; 1600 ; 1280 ; ...

**ڕادێ دەهێ یێ ئەڤێ ئێك ل دووڤ ئێکا ئەندازەیی بهەژمێرە.**

**5** 1600 ; 800 ; 400 ; 200 ; ...

**6** 0.0000001 ; 0.00001 ; 0.001 ; 0.1 ; ...

**7** -64 ; 96 ; -144 ; 216 ; ...

**8** 2 ; -6 ; 18 ; -54 ; ...

**ئەڤان پێدانیان بکاربینە بۆ هەژمارتنا ڕادەیێ هەشتێ بۆ ئێك ل دووڤ ئێکا ئەندازەیی.**

**9** $a_3 = 12$ و $a_6 = 96$

**10** $a_{15} = 100$ و $a_{17} = 25$

**11** $a_{11} = -4$ و $a_{13} = -36$

**12** $a_3 = -4$ و $a_5 = -36$

**ناڤەندێ ئەندازەیی بۆ هەر جووتەکێ ژماران بهەژمێرە.**

**13** 2 و 8

**14** 2 و 3

**15** 3 و 2

**سەرجەمێ داخوازکری بۆ هەر زنجیرەکا ئەندازەیی بهەژمێرە:**

**16** $S_7$ بە زنجیرەی $14 + 42 + 126 + 378 + \ldots$

**17** $\sum_{k=1}^{8} (-4)^{k-1}$

**شیکاربکە.**

**18** نامەیەکا ئەلیکترونی گەهشتە لاڤینێ، داخوازی ژ وێ کربوو بلا ئەو بۆ دەه هەڤالێن خو فرێکەت، و هەروەسا هەر ئێك ژ وان. بۆ دەه هەڤالێن خو فرێکەت. وەسا دانە کو ئەڤ کارە ب ئەڤێ شێوەی بەردەوام بوو. ژمارا نامەیێن دئاستێ هەشتێدا هاتین چەند بوون؟

ناف ______ بەروار ______ هۆبە ______

# راهێنان

وانەیا **5-6**

## دەرئەنجامێ بیرکاری *Mathematical Induction*

**دیاربکە، ئەرێ زنجیرەیا ئەندازەیی یا لیکدویربوونە یان یا لێکنێزیکبوونە.**

**1** $\frac{81}{625}+\frac{27}{125}+\frac{9}{25}+\frac{3}{5}+1+\ldots$ ______

**2** $1-\frac{3}{5}+\frac{9}{25}-\frac{27}{125}+\frac{81}{625}-\ldots$ ______

**سەرجەمێ هەر زنجیرەکا ئەندازەیی یا بێ دوماهیك بهەژمێرە ئەگەر هەبوو:**

**3** $7+\frac{7}{4}+\frac{7}{16}+\frac{7}{64}+\ldots$ ______

**4** $500-300+180-108+\ldots$ ______

**5** $\sum_{k=1}^{\infty}\frac{1}{4}\left(\frac{4}{3}\right)^k$ ______

**6** $\sum_{k=1}^{\infty}99\left(-\frac{4}{9}\right)^k$ ______

**هەر ژمارەیەکا رێژەیی یا دەوری وەك کەرتەك بنڤیسە ب سادەترین شێوە.**

**7** $0.\overline{16}$ ______

**8** $0.0\overline{16}$ ______

**9** $0.01\overline{6}$ ______

**10** $0.0\overline{45}$ ______

**11** $0.\overline{1}$ ______

**12** $0.\overline{123}$ ______

**دژە نموونەیەکێ بۆ هەلوەشاندنا هەر دەستەواژەیەکێ بینە.**

**13** $2^{-n}<n^2$ ______

**14** $n^3>3n$ ______

**شیکاربکە.**

**15** خەلاتەك بۆ شێرزاد دەرکەفت، و ب ئەڤی شێوەیی بۆ دهێتە دان: 200 مەلیون دینار ل سالا ئێکێ دهێنە دان، ل هەر سالەکا دی نیڤا پارێ سالا پێشتر بۆ دهێتە دان.

أ) هەر چار رادێن ئێکێ بۆ ئەڤێ زنجیرەیێ بنڤیسە.

ب) پێناسەکا ئاشکەرا بۆ ڤێ ئێك ل دووڤ ئێکا ئەندازەیی بنڤیسە، کو رادەیێ نوونی ئەوی پارەیی ل سالا $n$ وەردگریت بنوێنیت.

ج) ئەوی پارەیێ شێرزاد ل دەهـ سالێن ئێکێ وەردگریت بخەملینە. ______

د) هەکەر شێرزاد بێ دوماهیك بژیت، سەرجەمێ ئەوی پارەیێ وەردگریت دێ چەند بیت؟ ______

ناڤ ______________________________ بەروار ______________ هۆبە ____________________

# ڕاهێنان

وانەیا 1-7

## یاسایا Sin و Cos — Low of Sine and Cosine

بکارئینانا بژمێرێ، بەهایێن هەرسێ ڕێژەیێن سێگۆشەیی بهەژمێرە، بەرسڤان بۆ نێزیکترین بەش ژ سەدێ نێزیکبکە.

| | | |
|---|---|---|
| **1** $\sin 111^{o}$ ____________ | **2** $\cos 150^{o}$ ____________ | **3** $\tan 163^{o}$ ____________ |
| **4** $\sin 92^{o}$ ____________ | **5** $\cos 129^{o}$ ____________ | **6** $\tan 99^{o}$ ____________ |
| **7** $\sin 170^{o}$ ____________ | **8** $\cos 96^{o}$ ____________ | **9** $\tan 117^{o}$ ____________ |

یاسایا *Sin* بۆ هەژمارتنا هەر پیڤانەکێ بکاربینە، پیڤانێن درێژیان بۆ نێزیکترین دەهئێك، و پیڤانێن گۆشەیان بۆ نێزیکترین پلە نێزیکبکە.

$BC$ ____________ $DE$ ____________ $GH$ ____________

$m\widehat{J}$ ____________ $m\widehat{R}$ ____________ $m\widehat{T}$ ____________

یاسایا *Cos* بۆ هەژمارتنا هەر پیڤانەکێ بکاربینە، پیڤانێن درێژیان بۆ نێزیکترین دەهئێك، و پیڤانێن گۆشەیان بۆ نێزیکترین پلە نێزیکبکە.

$YZ$ ____________ $BD$ ____________ $EF$ ____________

$m\widehat{I}$ ____________ $m\widehat{M}$ ____________ $m\widehat{S}$ ____________

ناڤ ______________ بەروار ______________ هۆبە ______________

# ڕاهێنان

وانەیا **2-7**

## نەخشەیێن سێگۆشەیی *Trigonometric Functions*

**چەماوەیێن نەخشەیێن سێگۆشەیی یێن بنەڕەت بۆ وێنەکێشانا چەماوەیێ هەر نەخشەیەکێ بکاربینە.**
**فرەهیێ و ماوەیێ (دەمێ) دووبارەبوونێ ل هەردوو ڕاهێنانێن 1 و 2 دیاربکە.**
**ماوەیێ دووبارەبوونێ و خالێن ئێکودووبڕینێ ل ڕاهێنانا (3) ێ دیاربکە.**

**1** $b(x) = -5\sin \pi x$

**2** $k(x) = 3\cos 2\pi x$

**3** $g(x) = 2\tan \frac{\pi x}{2}$

**چەماوەیێن نەخشەیێن سێگۆشەیی یێن بنەڕەت بۆ وێنەکێشانا چەماوەیێ هەر نەخشەیەکی بکاربینە.**
**ئێکودووبڕینێن ئاسۆیی و لادانا روویی ل هەردوو راهێنانێن 4 , 5 دیاربکە. دەمێ دووبارەبوونێ و دەرکناران ل ڕاهێنانا (6)ێ دیاربکە:**

**4** $h(x) = \sin\left(x + \frac{\pi}{4}\right)$

**5** $h(x) = \cos\left(x - \frac{\pi}{4}\right)$

**6** $h(x) = \tan\left(x + \frac{\pi}{3}\right)$

**شیکاربکە.**

**7** أ چەماوەیێ نەخشەیا Sin ب کاربینە بۆ وێنەکێشانا پێلەکا (شەپۆل) دەنگی، هەکەر دەمێ دووبارەبوونێ 0.002 چرکە و فرەهیا وێ 2 cm بیت.

ب دووبارەبوونا ئەڤێ پێلێ چەندە ب (هێرتزان)؟

______________________________

y 2 1 0 -1 x 0 0.001 0.002 0.003

ناڤ ______ بەروار ______ هۆبە ______

# ڕاهێنان

وانەیا **3-7**

## هاوئەنجامێن سێگۆشەیی یێن بنەڕەت

*Fundamental Trigonometric Identity*

**هەر هاوئەنجامەکا سێگۆشەی ل خواریێ بسەلمینە:**

**1** $\sin^2\theta+\sin^2\theta\frac{1}{\tan^2\theta}=1$

**2** $\frac{1}{\cos^2\theta}\cos^2\theta=\frac{1}{\tan^2\theta}-\cos^2\theta$

**3** $\tan^2\theta-\tan^2\theta+\sin^2\theta=\sin^2\theta$

**4** $\frac{\sin\theta+\cos\theta}{\sin\theta\cos\theta}=\frac{1}{\cos\theta}+\frac{1}{\sin\theta}$

**هەر بڕەکی پێ cos θ بنڤیسە، پاشی سادەبکە:-**

**5** $2\sin\theta\cos\theta\frac{1}{\tan\theta}$

**6** $\frac{1+\frac{1}{\tan\theta}}{\frac{1}{\tan\theta}(\sin\theta+\cos\theta)}$

**7** $\cos^4\theta-\sin^4\theta+\sin^2\theta$

**شیکاربکە.**

**8** هاوکێشەیا $mg\sin\theta=\mu mg\cos\theta$ بکاربینە بۆ دیارکرنا گۆشەیا خلیساندنێ بۆ شەشپالۆیەکا داری لسەر ڕوویەکی خوەهر و تەڕ ژ بەفرێ دانای بیت هەکەر $\mu=0.17$. ______

ناڤ ______ بەروار ______ هۆبە ______

# ڕاهێنان

وانەیا 4-7

## هاوئەنجامێن سەرجەم و جیاوازیێ Sum and Difference Identities

**بەهایێ دروست بۆ هەر بڕەکی بهەژمێره:–**

**1** $\cos 120^{o}$ ______

**2** $\sin 315^{o}$ ______

**3** $\tan 255^{o}$ ______

**4** $\tan \frac{7\pi}{6}$ ______

**5** $\sin \frac{\pi}{12}$ ______

**6** $\cos \frac{3\pi}{4}$ ______

**دروستیا هەر هاوئەنجامەکێ دیاربکە.**

**7** $\sin\left(x-\frac{3\pi}{2}\right)=\cos x$ ______

**8** $\cos\left(x-\frac{\pi}{2}\right)=\sin x$ ______

**بەهایێ هەر بڕەکی بهەژمێره، بکارئینانا $\cos A=\frac{12}{13}$ ، $0 \le A \le 90^{o}$ و $\sin B=\frac{8}{17}$ ، $90^{o} \le B \le 180^{o}$ .**

**9** $\sin(A+B)$ ______

**10** $\cos(A+B)$ ______

**11** $\tan(A+B)$ ______

**12** $\sin(A-B)$ ______

**13** $\cos(A-B)$ ______

**14** $\tan(A-B)$ ______

**شیکاربکە.**

**15** هەکەر $ABC$، $A(1, 0)$، $B(10, 0)$، $C(2, 6)$ سەرێن سێگۆشەیا $ABC$ بن، و ئەڤ سێگۆشەیە هاتە دەوردان ل دۆر خالا بنەڕەت ب گۆشەیا $60^{o}$ ، پۆتانێن سەرێن سێگۆشەیا وێنەی بهەژمێره ب نێزیککرن بۆ نێزیکترین بەش ژ سەدی:–

أ ڕێزکریێ دەوردانێ و ڕێزکریێ سێگۆشەیێ دنوێنیت بنڤیسە. ______

ب ئەنجامێ لێکدانا هەردوو ڕێزکرییان بهەژمێره. ______

ج پۆتانێن داخوازکری بنڤیسە. ______

**16** بەرزە گۆشەیا سەرێ گرەکی $(15^{o})$. درێژیا ئەوێ ڕێیا بنکێ گری ل گەل سەرێ وی دگەهینت $800\,m$ بوو. بلنداهیا گری چەندە؟ ______

ناڤ ________________ بەروار ____________ هۆبە ________________

# ڕاهێنان

وانەیا **5-7**

## هاوئەنجامێن دووجارانی گۆشەیێ و نیڤا گۆشەییێ.

*Duble-Angle and Half- Angle Indentities*

**بهەژمێرە $\sin 2\theta$ ، $\cos 2\theta$ ، $\tan 2\theta$:**

**1** $\cos\theta = -\frac{12}{13}$ و $\pi < \theta < \frac{3\pi}{2}$

**2** $\sin\theta = \frac{\sqrt{6}}{10}$ و $0 < \theta < \frac{\pi}{2}$

**3** $\sin\theta = -\frac{2}{3}$ و $\frac{3\pi}{2} < \theta < 2\pi$

**4** $\tan\theta = -\frac{5}{6}$ و $\frac{\pi}{2} < \theta < \pi$

**هەر هاوئەنجامەکێ بسەلمینە:**

**5** $2\cos^2\theta = \cos 2\theta + 1$

**6** $\tan\theta = \frac{1-\cos 2\theta}{\sin 2\theta}$

**هاوئەنجامێن نیڤا گۆشەیێ بکاربینە بۆ هەژمارتنا بەهایێن دروست بۆ هەر بڕەکی سێگۆشەیی ل خوارێ:**

**7** $\tan 22.5^{\circ}$

**8** $\cos\frac{7\pi}{12}$

**9** $\sin\frac{11\pi}{12}$

**$\sin\frac{\theta}{2}$ ، $\cos\frac{\theta}{2}$ ، $\tan\frac{\theta}{2}$ بهەژمێرە هەکەر.**

**10** $\cos\theta = \frac{3}{5}$ و $270^{\circ} < \theta < 360^{\circ}$

**11** $\sin\theta = -\frac{\sqrt{5}}{3}$ و $180^{\circ} < \theta < 270^{\circ}$

**شیکاربکە.**

**12** خلیسانکەك درێژیا 35 m ئاسوییێ ژ سەر ئەردێ باخچەکی گشتی ڤەدگریت، و بلنداهیا وی 12 m بیت.

أ هاوکێشەکا سێگۆشەیی پێ گۆشا $\theta$ کو خلیسانك ل گەل ڕووییێ ئەردی پێکدئینت بنڤیسە.

ب خلیسانکەکا دی گۆشەیەکێ ل گەل ڕووییێ ئەردی دروستدکەت پیڤانا وێ دووجارانی پیڤانا گۆشەیا خلیساندنا ئێکێ بوو. خلیسانکا دووی هەمان درێژیا ئاسۆیی یا ئەردێ خلیسانکا ئێکێ ڤەدگرت. برەکی بنڤیسە بۆ هەژمارتنا بلنداهیا رەخێ خلیسانکا دووی ژ سەر ئەردی.

ج بلنداهیا خلیسانکا دووی بهەژمێرە، بەرسڤێ بۆ نێزیکترین مەتر نێزیکبکە.

ناڤ ________________________ بەرەوار ____________ هۆبە ______________

# پرۆژە

بەشێ
1

## تەنێن زێرین

### چالاكی (1): تەنێن ئەفلاتۆنی Platonic Solids

**چەند رووی** ژ چار چەند لایان یان زێدەتر پێكدهێت، ئەو روونە ئێكودوو دبڕن پێ لایان، هەموو روویێن چەند روویێ رێك دبنە چەند لایێن رێك و جووت بووین. هەروەسا ژمارا وان روویێن كو ئێكودوو دبڕن پێ هەر لایەكی ژ لایێن چەند رووی دێ یەكسان بن. دبێژنە چەند روویێن رێك **تەنێن ئەفلاتۆنی**. چەند روویێ **دووازدەی ئێكە ژ وان تەنان**. ل دووڤ رێنماییێن ل خوارێ سامپلەكێ دروست بكە بۆ چەند روویەكی دووازدەیی رێك.

**1** بكارئینانا كارتۆنێ دوو دانان ژ راخستیێ بەرامبەر دروستبكە.
ل دووڤ هێلێن خالدار لایێن وان بچەمینە.

**2** هەردوو پارچەیێن كارتۆنێ لسەر ئێكودوو دانە، و شەریتەكا لاستێكێ ل دۆر وان دانە، هەر وەكی ل خوارێ دیاركری.

**3** بهێلە شەریتا لاستیكێ وان چەند لاییان هێواش هێواش بلندبكەت بو دروستكرنا چەند روویەكی رێكی دووازدەی.

ناڤ ________________ بەروار __________ هۆبە ______________

## پڕۆژە

بەشێ **1**

## تەنێن زێرین (پاشکۆ)

**چالاکی 2** : تەنێن ئەرخەمیدس **Archimedean Solids**

تەنێن ئەرخەمیدس ناڤێ خۆ ژ ناڤێ زانایێ ئەفریقی ئەرخەمیدس وەرگرتییا. هەموو روویێن تەنێ ئەرخەمیدس چەند لایێن رێکن، کو بکێمی دوو جورێن چەند لایان بخۆڤەدگریت ب مەرجەکی رێزبەندیا چەند لایان ل دۆر هەر سەرەکی وەك ئێکودوونە.

**1** دوو دانەیان ژ راخستییێ ل خوارێ ژ کارتۆنێ دروستبکە. هەر کارتوونەکێ ببڕە و ل دووڤ هێلێن خالدار بچەمینە. پارچەیێن زێدە بکاربینە بۆ خڕڤەکرنا هەموو راخستی دنیڤ چەند روویەکی دا. پاشی هەردوو نیڤ روویان خڕڤەبکە بۆ دروستکرنا چەند روویەکی تمام. ئەو چەندroویێ بدەست تەکەفتی چەند روویەکی ئەرخەمیدییە.

**2** جۆرێ چەند لایان ل دۆر هەر سەرەکی ژ راخستییێ ل سەری چییە؟ ________________

**3** ژمارا چەند لایان ژ هەر جۆرەکی ل دۆر هەر سەرەکی چەندە؟ ________________

**4** رووبەرێ ئەوی چەند روویێ چەندە؟

________________

**5** کونەکا بچووك لنك سەرەکی چەند روویی دروستبکە. ئەوێ کونێ بکاربینە بۆ تژیکرنا چەند روویی ب لمێ. پاشی ئەوێ لمێ ڤالاکە دناڤ لولەکێدا یان زێدەتر ژ لوولەکەکێ. یاسایا قەبارێ لوولەکێ بکاربینە بۆ هەژمارتنا قەبارێ چەند روویێ. بەرسڤێ بۆ نێزیکترین سەنتیمەترێ سێجای نێزیکبکە.

# پرۆژە

بەشێ 2

## ل بلنداهیا ئەسمانی

**چالاکی 1** : نهۆم نهۆم

**1** ئەرێ تو باوەر دکەی کو پەیوەندیەکا هێلی هەیە لناڤبەرا بلنداهیا بورجەکی و ژمارا نهۆمێن بخۆڤەدگریت؟ بەرسڤا خۆ رونبکە.

**2** خشتێ ل خوارێ پێداییان لسەر بلنداهیا دوو برجان و ژمارا نهۆمێن وان دیاردکەت. ژمارا نهۆمان وەك گۆڕاوێ ئازاد [سەربەخو] بکاربینە.

| بورج | ژمارا نهۆمان | بلنداهیی ($m$) |
|---|---|---|
| بورجێ دوبەی | 162 | 818 |
| هەردوو بورجێن چێمك ل مالیزیا | 88 | 452 |

أ نموونەیەکا هێلی دیاربکە، پەوەندیا لناڤبەرا ژمارا نهۆمان و بلنداهیا بورجی بنوینت؟

ب لاری چ دنوێنیت د هاوکێشەیا ئەڤێ نموونێدا؟

ج ئێکودووبڕینا ڤێ نموونێ ل گەل تەوەرێ دووێ چ دنوێنیت؟ ئەرێ ئەڤێ ئێکودووبڕینیێ ڕامانەك هەیە دژیانا رۆژانەدا؟

---

**3** نموونەیا تە ل پرسیارا (2)ێ دیارکری بکاربینە. بلنداهیا بورجەکی ژ 140 نهۆمان پێکهاتبیت چەندە؟ ژمارا نهۆمێن بورجەکی بلنداهیا وی $700\ m$ بیت چەندە؟

---

**4** ئالوگۆرێ بکە لناڤبەرا گۆڕاوێ سەربەخۆ و گۆڕاوێ [پەیوەست]، و نموونەیا نوو دیاربکە؟

---

لاری ل نموونەیا نوو چ دنوێنیت؟ ئێکودووبڕینا وی ل گەل تەوەرێ دووی چ دنوێنیت؟

---

---

نموونەیا نوو بکاربینە بۆ هەژمارتنا ژمارا نهۆمان دبورچەکی دا، بلنداهیا وی 700m بیت. ئەرێ بەرسڤا تە دیتی هەمان بەرسڤە ل پرسیارا (3)ێ؟

---

ناڤ ________ بەروار ________ هۆبە ________

# پرۆژە

بەشێ **2**

## ل بلنداهیا ئەسمانی [پاشکۆ]

### چالاکی 2 : بلند و بلندتر

خشتەیێ ل خواری پێداییان لسەر گرنگترین بۆرجێن جیهانێ دیاردکەت.

| بورج | جھ | ژمارا نهۆمان | بلنداهی ب (مەتران) | بلنداهی ب پییان | سالا دروستکرنێ |
|---|---|---|---|---|---|
| بۆرجێ سیزر | وەلاتێن ئێکگرتی | 108 | 527 | 1 729 | 1974 |
| تایبیە101 | تایوان | 101 | 509 | 1 670 | 2003 |
| مەلبەندێ دارایێ جیهانێ | شانگهای – چین | 101 | 492 | 1 614 | 2008 |
| جون هانکوك | وەلاتێن ئێکگرتی | 100 | 457 | 1 500 | 1969 |
| هەردوو برجێن چێمك | مالیزیا | 88 | 452 | 1 483 | 1998 |
| ئەمپایر ستایت | نیویورك | 102 | 449 | 1 472 | 1931 |
| مەلبەندێ دارایێ جیهانێ | هونگ كۆك | 88 | 415 | 1 362 | 2003 |
| جین ماو | شانگهای – چین | 88 | 421 | 1 381 | 1998 |
| ناتجینغ | شانگهای – چین | 89 | 450 | 1 476 | 2009 |
| بۆرجێ دوبەی | دوبەی | 162 | 818 | 2 684 | 2009 |

**1** خالێن روونكرنێ دروستبكە، پەیوەندیێ دیاربكەت لناڤبەرا ژمارا نهۆمان (گۆڕاوێ سەربەخۆ) وبلنداهیێ ب مەتران. هندەك خالێن دی یێن روونكرنێ دروستبكە پەیوەندیێ لناڤبەرا ژمارا نهۆمان (گۆڕاوێ سەربەخو) و بلنداهیێ ب پێیان بنوێنت. خالێن روونكرنێ یێن سیێێ دروستبكە، پەیوەندیێ دیاربكەت لناڤبەرا سالا دروستكرنێ (گۆڕاوێ سەربەخو) و بلنداهیێ ب مەتران.

**2** راستەیێ بكاربینە، و باشترین راستەهێلێ نواندنێ ل دووڤ بوجوونێن خو بكێشە بو هەموو خالێن روونكرنێ. هاوكێشەیا وی راستەهێلی دیاربكە، و وێنەبكە.

**3** بژمێرا روونكرنێ بكاربینە بۆ هەژمارتنا هاوكێشا راستەهێلێ باشترین نواندن، بۆ هەر پەیوەندیەكێ و هاوكۆلكێ پەیوەست. «پێكڤە گرێدانێ» هێژا پێكڤە گرێدانا هیلی لناڤبەرا هەردوو گۆڕاوان دیاربكە ل هەر حالەتەكی.

**4** راستەهێلێ باشترین نواندن بكاربینە بۆ هەژمارتنا بلنداهیا بۆرجەكی ب پێیان هەكەر 95 نهۆم هەبن.

**5** راستەهێلی باشترین نواندن بكاربینە بۆ هەژمارتنا بلنداهیا بۆرجەكێ ب مەتران هەكەر 95 نهۆمە هەبن.

**6** پشت بەستن ب نموونەیا تەدیتی، تو پێشبینی دكەی ل چ سال بورجەكێ بلنداهیا وێ $1000\,m$ دێ تەمام بیت؟روونبكە هەكەر نموونەیا سێیێ یا هوور بیت.

# پرۆژە

بەشێ 3

## جیهانا تەكنۆلۆژیا

**چالاكی 1 : پێشكەفتنا تەكنۆلۆژیا**

چێدبیت ڕێزكری بكاربێن وەك ئامیرەكی كاریگەر بۆ ڕێكخستنا پێداییان و چارەسەریا وان.

**1** ڕاپرسینەكێ ل گەل 3 هەڤالێن خو دناڤ پۆلێدا ئەنجام بدە، لسەر ژمارا كاسێتێن مۆزیكێ *CD* یێ و ژمارا سیدیێن ڤیدیویێ كو ئەوی و خوشك و برایێن وێ هەنە. ڤان پێداییان درێزكرییەكێدا ڕێزبكە.

**ڕێزكریێ *A***

| | ڤیدێو | *CD* | مۆزیكێ |
|---|---|---|---|
| قوتابی 1 | | | |
| قوتابی 2 | | | |
| قوتابی 3 | | | |

**2** پرسیارێ بكە لسەر ناڤەندێ بهایێ هەر كاسێتەكا مۆزیكی و سیدیێ و ڤدیویێ و داشكاندنێن لسەر وان هاتینەكرن. ئەڤان بهایان دستوونا ئێكێدا ل ڕەخێ چەپێ ل ڕێزكریێ *B* تۆماربكە.

**ڕێزكریێ *B***

| | داشكاندن | بها |
|---|---|---|
| موزیك | | |
| CD | | |
| ڤیدیو | | |

**3** ڕێزكریێ *B* تەمامبكە ب تومارکرنا بەهایێن داشكاندنێ بۆ هەر كۆژمەكی دستوونا دوویێدا.

**4** ڕێزكریێ *AB* بهەژمێرە. هەر ڕێزەكێ و هەر ستوونەكێ ل ڤی ڕێزكریی ناڤبكە. ڕوونبكە هەر دانەیەكی ڕێزكری دەربڕینا چ دكەت.

# پرۆژە

بەشێ 3

## جیهانا تەکنۆلۆژیا [پاشکۆ]

### چالاکی 2 : گەهاندن

کۆمپانییێن راگەهاندنێ هەول ددەن پترترین پشکدار هەبن، دا پترترین قازانج بدەست بکەڤت. کۆمپانییێن مەزن ب رێکێن کەنالێن ئەسمانی و ئەنتەرنیتێ خزمەت گۆزارییێن پێدڤی ب تەلەفۆن و تەلەفزیۆنێ بۆ پشکداران دابیندکەن.

1 ژ دەوروبەرێ خۆ ناڤەندێ بهایێن پشکداریا هەیڤانە بزانە ل خزمەت گۆزاریا مۆبایلێ، کەنالێن ئەسمانی، ئەنتەرنێتێ.

2 خشتەیێ ل خوارێ داهاتێن 3 کۆمپانیان و رێژیا سەدی دیاردکەت بۆ پشکدارێن هەر ئێکێ ژوان ل هەر خزمەت گۆزاریەکێ ل باژێرەکی مەزن، [ئەو هەرسێ کۆمپانیە هەموو پشکدارێن ئەوی باژێری بخۆڤەناگرن]. سیستەمەکی هاوکێشەیێن هێلی بۆ دیارکرنا ژمارا هەموو پشکدارێن هەر خزمەت گۆزاریەکێ بنڤیسە. بکارئینانا خشتە و بهایێن بدەست تە کەفتین ل پرسیارا پێشتر.

| | داهاتێن هەیڤانە (دینار) | کەنالێن ئەسمانی % | مۆبایل % | ئینتەرنێت % |
|---|---|---|---|---|
| کۆمپانیا (1)ێ | 1 042 200 000 | 18 | 42 | 17 |
| کۆمپانیا (2)ێ | 552 200 000 | 10 | 18 | 30 |
| کۆمپانیا (3)ێ | 552 200 000 | 45 | 7 | 25 |

3 سیستەمێ پشتر شیکاربکە بۆ هەژمارتنا ژمارا پشکدارێن ل هەر خزمەت گۆزارەکێ.

4 وەسا چاڤەرێنە، کو ل سالێن ئایندەیێن نێزیك، ژمارا پشکداران ل خزمەت گۆزاریا کەنالێن ئەسمانی زێدەبیت ب رێژەیا 15%، و ل موبایلی ب رێژەیا 5% و ل ئینتەرنیتێ ب رێژەیا 22% . کاریگەریا ڤان زێدەبوونان لسەر داهاتین هەر ئێکێ ژ ئەڤان هەرسێ کۆمپانیان چەندە؟ بەرسڤا خو روونبکە.

ناڤ ______________________ بەروار ______________ هۆبە ____________________

# پرۆژە

بەشێ 4

## د کڤانەیدا بهەژمێرە

### چالاکی 1 : ڤەدیتنا کڤانەی

کڤانێ دەروازەیێ بـاژێری سانت لویس ل ئەمریکا بلندترین شویندارە ل ولایەتێن ئێکگرتی. ئەڤی کڤانەی شێوێ چەماوەیەکی هەیە. وەکو چەماوەیێ برگەیی هـاوتایە. دبێژنە ئەڤی جۆری چەماوەیی زنجیرەیی Catenary چونکی شێوەیێ وی وەك شیوێ زنجیرەکا شۆربووە. شێوەیێ گشتی بۆ هـاوکێشەیا ئەڤی جوری چەماوەیی ئەڤەیە:

$$y=\frac{a}{2}\left(e^{\frac{x}{a}}+e^{-\frac{x}{a}}\right) \text{ و } a\neq 0$$

**1** هـاوکێشەیا چەماوەیێ زنجیری بنڤیسە هەکەر $a=2$.

________________________________________

**2** خشتەیێ ل خوارێ تمامبکە، کو ڤەدگەڕێت بۆ نەخشەیا (1)ێ:

| $x$ | $-3$ | $-2$ | $-1$ | $0$ | $1$ | $2$ | $3$ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| $y$ | | | | | | | |

**3** تێبینیا چ دکەی لسەر بەهـایێن خشتەی؟ هـاوکێشەی بکاربینە بۆ روونکرنا هۆیێ ئەوێ تێبینیا تە کری؟

________________________________________

________________________________________

________________________________________

**4** چەماوەیێ زنجیرەیی بکێشە هەکەر $a=2$ ، بەحسێ ئەوی چەماوەیی بکە.

________________________________________

________________________________________

**5** چەماوەیێ زنجیری یێ بدەست تە کەفتی وەك چەماوەیێ برگەیێ هـاوتایە. هـاوکێشا وی برگەیێ هـاوتا کو وەك وێ بنڤیسە. ________________________________________

**6** بەراوردیێ بکە لناڤبەرا چەماوەیێ زنجیری و برگەیێ هـاوتا ئەوێ تە هـاوکێشەیا وی نڤیسی.

________________________________________

________________________________________

ناڤ ______________________ بەروار ____________ هۆبە ______________

# پرۆژە

بەشێ **4**

## دکڤانەکیدا بهەژمێرە (پاشکۆ)

**چالاکی 2 : دەربارەی چەماوەییێ زنجیرەیی**

شێوەیێ چەماوەییێ تە ل چالاکیا ئێکێ وێنەکری وەك کڤانێ دەروازەیەکی بەروڤاژیا. تو دکاری جهگۆهۆرکیان بکاربینی بۆ دەستکەفتنا وێنەیەکی گەلەك نێزیك بۆ وێنی کڤانێ وی دەروازەیی.

**1** چەوا هاوکشەیا چەماوەییێ زنجیرەیی د گۆهۆری بۆ بەرۆڤاژیکرنا کڤانەی؟ چەماوەییێ نەخشەیا پەیدابووی وێنەبکە بۆ ساخکرنا کاریێ خۆ.

______________________________

**2** بلنداهیا کڤانێ دەروازەیی 630 پێیە. نەخشەیا $y = 2x - \frac{a}{2}\left(e^{\frac{x}{a}} + e^{-\frac{x}{a}}\right)$ بکاربینە بۆ دروستکرنا سامپلەکێ بۆ کڤانێ دەروازەیەکی ئێکودووبڕینا وی یا ستوونی 630 پێ بیت. کیژ جۆرێ جهگۆهۆرکیان تە بکارئینە؟ ئەرێ ئەو سامپلێ نەخشەی د گونجیت ل گەل کڤانێ دەروازێ باژێرێ سانت لویس؟ بۆچوونێن خۆ روونبکە.

______________________________

**3** بلنداهیا کڤانێ دەروازەیێ باژرێ سان لویس 630 پێیە. و پانیا بنکێ وی دبیتە 630 پێ. ئەرێ ئەو سامپلێ نەخشەی دگونجیت ل گەل کڤانێ دەروازەیێ باژێری سانت لویس؟ بۆچوونێن خو رۆنبکە.

______________________________

______________________________

______________________________

ناڤ ________________ بەروار ____________ هۆبە ______________

بەشێ 5

# پڕۆژە

## پاشەڕۆیێن بۆشایێ

### چالاکی 1 : پارچەییێن ڕۆکێتان

ژ دەمێ هەلدانا ئێکەمین هەیڤا دەستگرد سبۆنتیك ( *Spotnik* ) بۆ ئەسمانی ل سالا 1957 و هەتا نوکە ب هزاران تەن ل بۆشایێ ژ دەرڤە هاتنە بجهـ هێلان ژ لایێ وان ڕۆکێتێن هاتینە بکارئینان بۆ هەلدانا ڤان هەیڤێن دەستگرد د وان گەشتاندا. ئەوێن دبوارێ بۆشایێ ئەسمانیدا کاردکەن پێدڤیاتی ب پێداییێن وان تەنین ل دۆر ئەردی زڤڕن هەنە، بۆ دیارکرنا مەترسییێن لێکدانان د گەشتێن داهاتیدا. بۆ نموونە، خشتەیێ ل خوارێ ژمارا ڤان تەنێن هاتینە خەملاندن ل ناڤبەرا 1965 و 1995 کو هەر پێنچ سالان جارەکێ هاتینە خەملاندن. دیاردکەت.

| سال | 1965 | 1970 | 1975 | 1980 | 1985 | 1990 | 1995 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارا تەنان | 175 | 350 | 525 | 700 | 875 | 1050 | 1225 |

1 کیژ جورێ نەخشەیان چێدبیت بکاربیت بۆ دروستکرنا نموونەکێ (سامپلەکی) بۆ پێداییێن خشتەی؟
بەرسڤا خو ڕۆنبکە. ______________________________

2 نەخشەکێ بنڤیسە کو ببیتە نموونەیەك بۆ ڤان پێداییان. سالان بکاربینە وەك گۆڕاوێ سەربەخۆ کو $x = 0$ سالا 1965 و $x = 5$ سالا 1970 بنوێنت و هەروەسا. ______________________________

3 وەسفەکێ بنڤیسە لسەر دەربڕینا ئەڤێ سامپلێ، و چەماوەی بکێشە.

4 ئەڤێ سامپلێ بکاربینە بۆ خەملاندنا ژمارا تەنان ل ئەسمانی ل سالا 2020 .

### چالاکی 2 : سەچمێن ڕۆکێتان

خشتەیێ ل خوارێ پێداییان ب ژمارەیێن خەملاندی بۆ سەچمێن ڕۆکێتێن دبۆشایێ ئەسمانیدا دزڤڕن دیاردکەت. ل ناڤبەرا سالا 1965 هەتا 1995 کو هەر پێنچ سالان جارەکێ هاتینە خەملاندن.

| سال | 1965 | 1970 | 1975 | 1980 | 1985 | 1990 | 1995 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارا سەچمان | 900 | 1850 | 2250 | 2600 | 3200 | 2900 | 3300 |

1 خالێن روونکرنێ دیاربکە پێداییێن خشتەی بنوێنن. سالان وەك گۆڕاوێ سەربەخۆ بکاربینە ($x = 0$ سالا 1965 دنوێنت) و ژمارا سەچمان وەك گۆڕاوی بەستراو [پشت بەست].

2 بژمێرا روونکرنێ بکاربینە بۆ هەژمارتنا نموونەکا هێلی و نموونەکا دووجای و نموونەکا سێجای و نموونەکا توانی بۆ پێداییێن خشتەی.

3 ل دووڤ بۆچوونا تە کیژ نموونە دروستتر دیاردبیت؟ بەرسڤا خۆ روونبکە.

4 ئەوێ نموونەیا ژمارا سەچمان گەلەك بنێزیکی دیاردکەت بکاربینە بۆ خەملاندنا ژمارا سەچمان ل سالا 2020 ؟

ناڤ ______ بەروار ______ هۆبە ______

بەشێ **6**

# پرۆژە

## لاکێشەیێن زێرین

### چالاکی 1 : رێژەیا زێرین

ئێك ل دووڤ ئێکا فیبوناتشی *Fibonacci* ب پەیوەندیەکا گرنگ یا گرێدایيە ل گەل هەر ئێکێ ژ هونەر و تەلارسازیێ، دبێژنێ رێژەیا زێرین.

**1** ئێك ل دووڤ ئێکا فیبوناتشی، ئێك ل دووڤ ئێکەکە ڕادێ وێ یێ ئێکێ و دووێ یەکسانە ب 1 ، و هەر رادەیەکی وێ یی دی دەستپێکرن ژ رادەیێ سیێ یەکسانە سەرجەمێ هەر دوو ڕادەیێن پێشتر. دووازدە ڕادین ئێکی یێن ڤێ ئێك ل دووڤ ئێکێ بنڤیسە.

**2** دەستپێکرن ب رادێ پێنجێ، رێژا هەر رادەکی بۆ ڕادێ پێشتر بهەژمێرە، بەرسڤێ بۆ نێزیکترین بەش ژ هزاری نێزیکبکە.

$\frac{144}{89} \approx$ $\frac{89}{55} \approx$ $\frac{55}{34} \approx$ $\frac{34}{21} \approx$ $\frac{21}{13} \approx$ $\frac{13}{8} \approx$ $\frac{8}{5} \approx$

**3** دەستەواژەیەکێ بنڤیسە بەحسێ ئەڤێ رێژێ بکەت.

### چالاکی 2 : لاکێشەیا زێرین

**1** رێژەیا زێرین ل ئەندازێ و هونەری و تالارسازیێ دیاردبیت. چارگۆشەیا $ABCD$ لسەر کاغەزێ وینەبکە، ناڤەراستا $\overline{AB}$ دیاربکە و ناڤێ وێ بکە $E$ ، ناڤبەرا هەردوو خالێن $E$ و $C$ ب پارچەراستەهێلەکی خالدار بگەهینە، هەر وەکی دیار ل وێنەیێ بەرامبەر. پرگالی ب درێژیا $\overline{EC}$ ڤەکە و بکاربینە بۆ وێنەکرنا $\overline{EF}$. راستەهێلەکێ تەریب بۆ راستەهێلی $AD$ بکێشە و دخالا $F$را ببۆریت، راستەهێلی $\overline{DC}$ لسەر راستیا وی درێژبکە هەتا بگەهیتە راستەهێلی پیشتر و ناڤێ خالا ئێکودووبرینا وان دانە $G$ . لاکێشەیا $AFGD$ ب دەست تە کەفت.

**2** پیڤانێ بکاربینە بۆ هەژمارتنا ئەڤان هەردوو رێژەیێن ل خوارێ، بەرسڤێ بۆ نێزیکترین بەش ژ هزارێ نێزیکبکە.

$\frac{BC}{BF} \approx$ $\frac{AF}{AD} \approx$

**3** لاکێشەیا زێرین ئەو لاکێشەیە کو رێژا درێژیا لایێ درێژتر بۆ لایێ کورت یەکسانە رێژەیا زێرین. لاکێشەیێن زێرین ل وێنەیی هاتیە دروستکرن کیژ وانن؟ (هاریکاری: پتر ژ لاکێشەیەکا زێرین هەیە).

**4** تابلۆیەکی هۆنەری دروستبکە بکێماسی سێ لاکێشەیێن زێرین تیدا هەبن.

ناف ________________ بەروار ____________ هۆبە ______________

بەشێ 7

# پرۆژە

## جالجالۆکا زڤرۆك

### چالاکی 1 : جالجالوکا زڤرۆك

ل دەمێ پایسکلەك لسەر رێیەکی دچیت، جالجالۆکەك ب تایرێ وێڤە هاتە نووسان. لێکۆلینێ لسەر رێرەوێ جالجالۆکێ بکە، هەر وەسا لێکۆلینێ بکە لسەر پەیوەندیا لناڤبەرا رێکێ و گۆشەیا زڤراندنا تایرێ ل دەمێ تایر بەرەڤ پێش دچیت.

1 وێنەیێ بەرامبەر، جهێ بنەڕەت بۆ جالجالۆکێ دیاردکەت، و جهێ وێ پشتی تایرە $45^o$ زڤری. هەکەر نیڤتیرێ تایرێ ئێك پێ بیت. دووریا تایر دبڕیت چەندە هەکەر $45^o$ بزڤڕیت.

2 تایری و جالجالۆکێ وێنەبکە بۆ دیارکرنا جهان. دەمێ تایر $45^o$ دزڤڕت هەتا تایر خۆلەکەکا تەمام دروست دکەت.

3 ناڤبەرا جهێن جالجالوکی ب چەماوەیەکی گونجای بگەهینە.

4 شێوێ ئەوی چەماوەیی هاتە وێنەکر چییە؟

### چالاکی 2 : یاسایا مۆری Morrie

ژ هاوئەنجامێن سێگۆشەی، هاوئەنجامەك هەیە و دبێژنێ یاسایا موری *Morrie* ئەڤ ناڤە زانایێ فیزیایێ ریتشارد ڤیمان *Richard Feynman* دانایە سەر ڤێ هاوئەنجامێ، کو زارۆکەکی هزرکار بناڤێ موریێ جاکویس *Morrie Jacobs* بەحسێ ئەڤێ هاوئەنجامێ کربوو.

1 دەقێ یاسایا مۆری ئەڤەیە $(\cos 20^o)(\cos 40^o)(\cos 80^o) = \frac{1}{8}$ . بژمێرێ بکاربینە بۆ ساخکرنا ئەڤێ پەیوەندییێ.

2 هەروەسا بژمێرێ بکاربینە بۆ ساخکرنا $(\cos 30^o)(\cos 60^o)(\cos 120^o) = \frac{1}{12}$، کارێ خو رۆنبکە.

3 دەقێ یاسایا موری ئەڤەیە $8(\cos a)(\cos 2a)(\cos 4a) = \frac{\sin 8a}{\sin a}$ دروستیا ڤێ یاسایی ساخبکە هەکەر $a = 20^o$ .

4 هاوئەنجامێ بسەلمینە $8(\cos a)(\cos 2a)(\cos 4a) = \frac{\sin 8a}{\sin a}$ (هاریکاری: لایێ راستێ چەند جاران بگۆهۆرە بکارئینانا هاوئەنجامێن دوو جارانی گۆشەیێ بۆ یاسایا sın).

ناڤ ـــــــــــــــــــ بەروار ـــــــــــــــــــ هۆبە ـــــــــــــــــــ

بەشێ 1

# بەرسڤێن پرۆژەی

## تەنێن زێرین

### چالاکی 1 : تەنێن ئەفلاتۆنی

**کەرەستە و ئامیر**: کارتۆن، مقەس، پەرێن پیڤەنووس.

**پێشینەیا بیرکاری**: دڤێت قوتابی بزانن، راخستنا تەنێ ئەندازەی چییە، و چەوا تەنەکی ئەندازەی ژ راخستنا وی دروست دکەن.

باشترە قوتابی دەستپێبکەت ب راخستنێن شەشپالۆیی و هەرەم و لوولەکێ.

**بەرفرەهکرن**: بێژە قوتابیان کو ژمارا تەنێن ئەفلاتۆنی (5) تەنن. قوتابیان هانبدە بۆ دیارکرنا چوار تەنێن دی.

**بەرسڤ**: کارێ قوتابیان ساخبکە ب بەراوردکرنا وی ل گەل ئەڤێ دووازدە روویێ ل خوارێ.

### چالاکی 2 : تەنێن ئەرخەمیدس

**کەرەستە و ئامیر**: کارتۆن، مقەس، پەرکێن پێڤەنووس، لما هویر، لوولەك.

**پێشینەیا بیرکاری**: دڤێت قوتابی هەژمارتنا رووبەرێ شەشلا و پێنجلایێ بزانن.

**بەرفرەهکرن**: بێژە قوتابیان کو ژمارا تەنێن ئەرخەمیدس (13) تەنن، قوتابیان هانبدە بۆ دیارکرنا تەنێن ئەرخەمیدس یێن دی.

**بەرسڤ**:

1 کارێ قوتابیان ساخبکە، دڤێت ئەو تەنێ قوتابیان دروستکری لسەر شێوەیێ تەپا پێ بیت.

2 شەشلا و پێنجلا.

3 دوو شەشلا و پێنجلایەك.

4 کارێ قوتابیان ساخبکە.

ناڤ ______________ بەروار ______________ هۆبە ______________

# بەرسڤێن پرۆژەی

بەشێ 2

## ل بلنداهیا ئەسمانی

### چالاکی 1 : نهۆم نهۆم

**کەرەستە و ئامیر:** بژمێرا رونکرنێ.

**پێشینەیا بیرکاریێ:** دڤێت قوتابی نواندنا پێداییێن خشتەی ب خالێن رونکرنێ بزانن، و چەوا سامپلەکی بیرکاریێ بۆ نواندنا کۆمەلا پێداییان دیاردکەن.

**بەرسڤ:** کارێ قوتابیان ساخبکە.

**بەرسڤێن پێشبینکری**

**1** بەلێ پەیوەندییەکا هێلی هەیە لناڤبەرا ژمارا نهۆمێن تەوەری (بورج) و بلنداهیا وی. بلنداهیا بورجێ ب رێژەیەکا نەگۆڕ زێدە دبیت، ئەو بلنداهیا نهۆمێیە. هەر چەند ژمارا نهۆمان زێدە ببیت نهۆم ب نهۆم، بلنداهیا وی بورجی زێدەدبیت.

**2** لارێ نەخشەیا هێلی، ئەوا بلنداهیا بۆرجی پێ ژمارا نهۆمێن وی دنوێنیت ل دووڤ پێداییێن هەردوو بورجان ئەڤەیە:
$$m = \frac{y_2 - y_1}{x_2 - x_1} = \frac{818 - 452}{162 - 88} = \frac{183}{37} \approx 4.95$$

لێ ئێکودووبرینا ستوونی b: ب رێیا نڤیسینا ئێکی ژ هەردوو بورجان پاسەدانا سامپلی دکەت و دهێتە دیارکرن.
$$b = y_1 - mx_1 = 452 - 4.95 \times 88 = 16.4$$

سامپلی هێلی ئەڤەیە $f(x) = 4.95x + 16.4$

د ئەڤێ سامپلێ دا لاری ناڤەندێ بلنداهیا نهۆمەکێ دنوێنیت لێ ئکودووبڕینا ستوونی b، بلنداهیا بەری نهۆما ئێکی ل بورجی دنوێنیت.

بەلێ ئێکودووبڕینا ستوونی b رامان هەیە د ژیانا رۆژانەدا، چونکی ئەو بلنداهیا ل پێش نهۆما ئێکێ ل بورجی دیاردکەت.

**3** بلنداهیا بورجەکی 140 نهۆمە ل دووڤ ئەڤێ سامپلێ دبیتە 709m بنێزیکی. $f(140) = 4.95 \times 140 + 16.4 \approx 709$

بۆ خەملاندنا ژمارا نهۆمێن بورجەکی هەکەر بلنداهیا وی 700m بیت، دڤێت ئەڤێ هاوکێشەیێ شیکاربکەین $700 = 4.95x + 16.4$ بەرسڤ ئەڤەیە: 138 نهۆم بنێزیکی.

**4** هەکەر ئالوگۆرێ لناڤبەرا هەردوو گۆراوێن سەربەست و بەستراو بکەین، ئەڤ سامپلێ ل خوارێ ب دەست مە دکەڤیت:
$$g(x) = \frac{1}{4.95}(x - 16.4) \approx 0.2x - 3.31$$

ئەڤە ژمارا نهۆمێن بورجی دیاردکەت ل دووڤ بلنداهیا وی.

لاری د ئەڤێ سامپلێدا ئەوی بەشێ بەرامبەر بلنداهیا ئێک مەترێ بۆرجی دنوینیت. لێ ئێکودووبڕینا ستوونی بلنداهیا بورجێ دنوێنیت هەکەر هەموو نهۆمێن وی لا بدەن.

هەکەر مە بڤێت سامپلێ دووێ بکاربینین بۆ دیارکرنا ژمارا نهۆمان ل بورجەکی بلنداهیا وی 700 m ، دڤێت $g(700)$ بهەژمێرین. $g(700) \approx 0.2 \times 700 - 3.31 \approx 137$

ئەڤ بەرسڤە یا جیاوزە ژ بەرسڤا پرسیارا (3) ێ، کو سامپلی ئێکێ هاتبوو بکارئینان. جیاوازی لناڤبەرا هەردوو بەرسڤان ئێك نهۆمە. ئەگەرێ ئەڤێ جیاوازیێ چونکی هەژمارتنێن مە بنێزیککرنێ بوون. کو ئەڤە رێددەن هەموو ئەو بەشێن هاتینە فەراموشکرن نهۆمەکێ پێکبینن. دڤێت ئەم بەرچاڤ وەربگریت کو هەموو ئەو سامپلێن بیرکاری ئەوێن دهێنە بکارئینان ل ژیانا رۆژانە سامپلێن نێزیککرینە دەمێ ئەم رەفتارێ ل گەل دکەین.

ناڤ ______________ بەروار ______________ هۆبە ______________

# بەرسڤێن پۆژەی

بەشێ **2**

## ل بلنداهیا ئەسمانی [پاشکۆ]

**چالاکی 2 : نهۆم نهۆم**

**کەرەستە و ئامیر:** بژمێرا روونکرنێ، راستەکا رۆن.

**پێشینەیا بیرکاری:** دڤێت قوتابی نواندنا پێدایێن خشتەی ب خالێن روونکرنێ بزانن، و چەوا سامپلەکی بیرکاری بۆ نواندنا کۆمەلا پێداییان دیاربکەن.

**بەرسڤ:** کارێ قوتابیان ساخبکە

**بەرسڤا پێشبینکری**

ناڤ ______________________ بەروار ____________ هۆبە ______________

بەشێ 2

# بەرسڤێن پرۆژەی

## ل بلنداهیا ئەسمانی [پاشكو]

**2** كارێ قوتابیان ساخبكە.

**3** پەیوەندی ل ناڤبەرا ژمارا نهۆمان و بلنداهییێ ب مەتران $y = 5.22x - 37.44$ $r = 0.98$ پێكڤە گرێدانەكا [پەیوەستی] بهێزە.

پەیوەندی ل ناڤبەرا ژمارا نهۆمان و بلنداهییێ ب پێیان: $y = 17.14x - 123.26$ $r = 0.98$ پێكڤە گرێدانەكا بهێزە.

پەیوەندی ل ناڤبەرا سالا ئاڤاكرنێ و بلنداهییێ ب مەتران $y = 1.13x - 1748.79$ $r = 0.24$ پێكڤە گرێدانەكا لاوازە.

**4** بلنداهیا بورجەكی ژ 95 نهۆمان پێكهاتبیت دبیتە 1505 m پێ بنێزیكی.

**5** بلنداهیا بورجەكی ژ 95 نهۆمان پێكهاتبیت دبیتە 458 m بنێزیكی.

**6** ل دووڤ سامپلێ سێ، ئەو بۆرجێ بلنداهیا وی $1\,000\,m$ ل سالا 2433 بنێزیكی دهێتە ئاڤاكرن. هوربینیا سامپلێ سێ یا لاوازە چونكی هاوكۆلكێ پێكڤەگرێدانێ گەلەكێ بچووكە.

بەشێ 3

# بەرسڤێن پرۆژەی

## جیهانا تەکنۆلۆژیا

### چالاکی 1 : جیهانا تەکنولۆژیا

**بەرسڤ:** جۆرا و جۆرن

**بەرسڤین پیشبینکری**

**1**

( ڤیدیۆ CD کاسێت)

قوتابیێ (1)ێ
قوتابیێ (2)ێ
قوتابیێ (3)ێ

$$A = \begin{bmatrix} 10 & 20 & 5 \\ 2 & 30 & 2 \\ 15 & 50 & 5 \end{bmatrix}$$

**2**

داشکاندن بها

کاسێت
CD
ڤیدیۆ

$$B = \begin{bmatrix} 2000 \\ 5000 \\ 15\,000 \end{bmatrix}$$

**3**

داشکاندن بها

کاسێت
CD
ڤیدیۆ

$$B = \begin{bmatrix} 2000 & 500 \\ 5000 & 1000 \\ 15\,000 & 3000 \end{bmatrix}$$

**4**

داشکاندن بها

قوتابیێ (1)ێ
قوتابیێ (2)ێ
قوتابیێ (3)ێ

$$AB = \begin{bmatrix} 195\,000 & 40\,000 \\ 184\,000 & 37\,000 \\ 355\,000 & 725\,000 \end{bmatrix}$$

هەر دانەیەکی ل ستوونا رەخێ چەپێ دەربڕینێ ژ سەرجەم بهایێ وان تشتێن ئەوی قوتابی کڕین دکەت کو بەرامبەری وێ ل رەخێ چەپێ. لێ هەر دانەیەکی ل ستوونا رەخێ راستێ بەرابەری وی دەربرینێ ژ سەرجەم داشکاندنێن بدەست کەفتی دکەت.
بۆ نموونە: بهایێ کڕیارا ئەوان تشتێن ئەوی قوتابی کڕین 000 195 دینارن و سەرجەمێ داشکاندنێ 04 000 دینارن.

ناڤ ________ بەروار ________ هۆبە ________

# بەرسڤێن بەشێ

بەشێ 3

## جیهانا تەکنۆلۆژیا [پاشکۆ]

**چالاکی 2 : گەهاندن**

**بەرسڤ:** جۆرا و جۆرن.

**بەرسڤێن پێشبینکری**

**1** تێکرایێ پشکداریێ ل موبایلێ: 75000 دینار .

تێکرایێ پشکداریێ ل ئینتەرنێتێ: 50000 دینار.

تێکرایێ پشکداریێ ل تەلەفزیۆنێ: 15000 دینار.

**2** $\begin{bmatrix} 0.18 & 0.42 & 0.17 \\ 0.1 & 0.18 & 0.3 \\ 0.45 & 0.07 & 0.25 \end{bmatrix} \begin{bmatrix} S \\ T \\ I \end{bmatrix} = \begin{bmatrix} 1\,042\,200\,000 \\ 552\,200\,000 \\ 690\,300\,000 \end{bmatrix}$ S کەنالێن ئەسمانی دنوێنت، T موبایلێ و I ئینتەرنێتێ دنوینت.

یان
$$\begin{cases} (0.18S)(15\,000)+(0.42T)(75\,000)+(0.17I)(50\,000)=1\,042\,200\,000 \\ (0.1S)(15\,000)+(0.18T)(75\,000)+(0.3I)(50\,000)=552\,200\,000 \\ (0.45S)(15\,000)+(0.07T)(75\,000)+(0.25I)(50\,000)=690\,300\,000 \end{cases}$$

یان
$$\begin{cases} 2700S+31\,500T+8500I=1\,042\,200\,000 \\ 1500S+13\,500T+15\,000I=552\,200\,000 \\ 6750S+5250T+12\,500I=690\,300\,000 \end{cases}$$

**3** ژمارا پشکداران ل خزمەت گۆزاریا تەلەفزیۆنێ $S = 70\,000$ بنێزیکی.

ژمارا پشکداران ل خزمەت گۆزاریا موبایلێ $T = 25\,200$

ژمارا پشکداران ل خزمەت گۆزاریا ئینتەرنیتێ $I = 7200$

**4** دئایندەدا ژمارا پشکداران ل خزمەت گۆزاریا تەلەفزیۆنێ دێ بیتە $70\,000 \times 1.15 = 80\,500$ و ژمارا پشکداران ل خزمەت گوزاریا موبایلێ دێ بیتە $25\,200 \times 1.05 = 26\,460$ و ژمارا پشکداران ل خزمەت گوزاریا ئینتەرنێتێ دێ بیتە $7200 \times 1.22 = 8784$ بۆ دیارکرنا داهاتیێ نوو بۆ کۆمپانیان ئەڤێ بهەژمێرە:

$$\begin{bmatrix} 0.18\times 15\,000 & 0.42\times 75\,000 & 0.17\times 50\,000 \\ 0.1\times 15\,000 & 0.18\times 75\,000 & 0.3\times 50\,000 \\ 0.45\times 15\,000 & 0.07\times 75\,000 & 0.25\times 50\,000 \end{bmatrix} \begin{bmatrix} 80\,500 \\ 26\,460 \\ 8784 \end{bmatrix} = \begin{bmatrix} 1\,125\,504\,000 \\ 609\,720\,000 \\ 792\,090\,000 \end{bmatrix}$$

دەستکەفتیێن نوو بۆ کۆمپانیان ئێك ل دووڤ ئێك دبنە 000 504 125 1 دینار 000 720 609 دینار 000 090 792 دینار.

ناڤ ______________ بەروار ______________ هۆبە ______________

بەشێ **4**

# بەرسڤێن پرۆژەی

## $e$ دکڤانەکێدا بهەژمێرە

**چالاکی 1 : کڤانەی دیاربکە.**

**کەرەستە و ئامیر:** بژمێرا روونکرنێ یان پەرێن روونکرنێ [بەیانی].

**پێشینەیا بیرکاری:** دڤێت قوتابی بزانن چەوا بەهایێ نەخشەیەکێ بهەژمێرن بەرامبەر بەهایەکی دیارکری بۆ گۆڕاوێ سەربەخۆ.

**بەرفرەهکرن:** بێژە قوتابیان کو ئەو نەخشەیا چەماوەیێ وێ زنجیرە، نەخشەیەکا ژ کۆمەلەکا نەخشەیان پێکدهێت، و قوتابی ل قوناغێن بلند دێ خوینت. و ئەو نەخشەیێن بڕگەیێ زیادن.

**بەرسڤ:**

**1** $y = e^{\frac{x}{2}} + e^{-\frac{x}{2}}$

**2**

| $x$ | $-3$ | $-2$ | $-1$ | $0$ | $1$ | $2$ | $3$ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| $y$ | 4.70 | 3.09 | 2.26 | 2 | 2.26 | 3.09 | 4.71 |

**3** بەهایێن نەخشەی دێ یەکسان بن بەرامبەر بەهایێن دژێ ئێکودوو بۆ گۆڕاوێ ئازاد. چونکی.

$f(x) = e^{\frac{-x}{2}} + e^{-\frac{-x}{2}} = e^{-\frac{x}{2}} + e^{\frac{x}{2}} = f(x)$.

**4** ئەڤ چەماوە وەك چەماوەیێ نەخشەیا دووجایی دیاردبیت.

لێ لنك سەرێ ڤێ کێمتر ناڤچال دیاردبیت.

**5** هاوکێشەیا بڕگەیێ هاوتا کو د خالێن $(-2, f(-2))$ $(0, f(0))$ $(2, f(2))$ را دبۆریت ئەڤەیە $y = 0.27x^2 + 2$ .

**6** هەردوو چەماوە بۆ بەهایێن $x$ ل ماوەیێ $[-2,2]$ دێ جووت بن بنێزیکی.

و وەسا دیار دبیت کو بەهایێن نەخشەیا چەماوەیێ زنجیرەی مەزنترە ژ بەهایێن نەخشەیا دووجای، دەمێ $x$ بەهایان وەردگریت ژ دەرڤەی ماوەیێ $[-2,2]$.

# بەرسڤێن پڕۆژەی

بەشێ **4**

## $e$ دکڤانەکێدا بهەژمێرە [پاشکۆ]

**چالاکی 2** : دەربارەی چەماوەیێ زنجیرەیی

**کەرەستە و ئامیر**: بژمێرا روونکرنێ یان پەڕێن رونکرنێ [بەیانی].

**پێشینەیا بیرکاری**: دڤێت قوتابی بزانن چەوا نەخشەیەکێ دگۆهۆڕن ب جهگۆهۆرکەکا ئەندازەیی.

**بەرسڤ**

**1** دێ راپم ب گۆهۆڕینا چەماوەی ب وێنەدانەوە ل دۆر تەوەرێ ئێکێ، و دێ راپم ب وێنەکرنا چەماوەیێ نەخشەیا $f(x)$ – .

**2** ئێکودووبرینا ستوونی بۆ نەخشەیا $y = 1260 - 315\left(e^{\frac{x}{630}} + e^{-\frac{x}{630}}\right)$ دبیتە 630، من وێنەدانەوەیەك ل دۆر تەوەرێ ئێکێ بکارئینا، باشی راکێشانەك بۆ سەری ب بڕی 1260 .

**3** نەخێر، چونکی دووری لناڤبەرا هەردوو خالێن ئێکودوو برینا چەماوەیی ل گەل تەوەرێ ئێکێ کو ئەو روویێ ئەردییە گەلەك مەزنترە ژ (603)ێ.

ناڤ______________________________ بەروار ______________ هۆبە ______________

# بەرسڤێن پرۆژەی

بەشێ 5

## پاشماییێن بۆشاییێ

### چالاکی 1 : سەچێن رۆکێتان

**کەرەستە و ئامیر:** بژمێرا رووونکرنێ یان پەرێن رووونکرنێ [بەیانی].

**پێشینەیا بیرکاری:** دڤێت قوتابی بزانن چەوا سامپلەکی بیرکاری [یاسایەکا بیرکاری] بۆ نواندنا کومەلەکا پێداییان دیاربکەن.

**بەرفرەهکرن:** بێژە قوتابیان کو زێدەبوونا پاشماییان دبۆشاییێدا بوویە کێشەیەك رێ دگریت بۆ ئەنجامدانا گەشتان دبۆشاییێ ئەسمانیدا چونکی دەوردانا هەیڤێن دەستکرد دبۆشاییێدا تۆشی مەترسیان دبن.

**بەرسڤ**

**1**

| سال | 1965 | 1970 | 1975 | 1980 | 1985 | 1990 | 1995 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| $x$ | 0 | 5 | 10 | 15 | 20 | 25 | 30 |
| ژمارا پارچەیان $x$ | 175 | 350 | 525 | 700 | 875 | 1050 | 1225 |

چونکی جیاوازییێن بنەرەت یەکسانن، ڤێجا یاسایا هێلی یا گونجاییە.

**2** $y = 35x + 175$

**3** ژمارا پارچێن رۆکێتان ل سالا 1960 (سالا 0 ) 175 پارچەبوون، و ئەڤە زێدەبوو ب تێکراییێ 35 پارچان د سالەکێدا.

**4** بەهایێ x ل سالا 2020 دبیتە 55 ، ژمارا پارچێن رۆکێتان دبۆشاییێدا ل سالا 2020 ل دووڤ ئەڤێ سامپلێ [یاسایێ] 2100 پارچەنە $(35 \times 55 + 175)$

ناڤ ________________ بەروار ____________ هۆبە ______________

# بەرسڤێن پرۆژەی

بەشێ 5

## پاشمایێن بوشاییێ [پاشکۆ]

### چالاکی 2 : سەچمێن رۆکێتان

**کەرەستە و ئامیر:** بژمێرا روونکرنێ یان پەرێن روونکرنێ [بەیانی].

**پێشینەیا بیرکاری:** دڤێت قوتابی بزانن چەوا سامپلەکی بیرکاری [یاسایەکێ] بۆ نواندنا کومەلا پێدایان دیاربکەن.

**بەرفرەهکرن:** قوتابیان ئەگەهداربکە کو زێدەبونا پاشماییان دبوشاییێدا بوویە کێشەیەکا مەزن رێ دگریت بۆ ئەنجامدانا گەشتێن هەیڤێن دەستکرد دبوشاییێدا. چونکی دەوردانا هەیڤێن دەستکرد توشی مەترسیان دبن.

بەرسڤ

1

2 سامپلەکی هێلی [یاسایەکا هێلیێ]: $y = 73.21x + 1330.36$ .

سامپلەکی دووجایی $y = -2.74x^2 + 155.36x + 988.10$ .

سامپلەکی سێجایی $y = 0.09x^3 - 6.74x^2 + 199.8x + 921.43$ .

سامپلەکی توانی $y = 1299.94(1.04)^x$ .

3 وەسا دیاردبیت کو هەردوو سامپلێن دووجای و سێجای دگونجاینە، لێ باشترین سامپل، سامپلێ سێجاییە، چونکی ژمارا سەچمان بەردەوام دێ زێدەبن.

4 6496 سەچمە بنێزیکی.

ناڤ ________ بەروار ________ هۆبە ________

# بەرسڤێن پرۆژەی

بەشێ 6

## لاکێشەیێن زێرین

### چالاکی 1 : رێژەیا زێرین

**کەرەستە و ئامیر:** بژمێر.

**پێشینەیا بیرکاری:** دڤێت قوتابیان پێزانین هەبن لسەر ئێك ل دووڤ ئێکان، و چەوا رادەیێن ئێك ل دووڤ ئێکەکا پێناسەکری ب پێناسەکا نەدیار دهەژمیرن.

**بەرسڤ**

1 ئێکەمین رادەیێن ئێك ل دووڤ ئێکا فیبوناتشی ئەڤەنە ... 1, 1, 2, 3, 5, 8, 13, 21, 34, 55, 89, 144,

2 $\frac{8}{5}\approx1.6$ ، $\frac{13}{8}\approx1.625$ ، $\frac{21}{13}\approx1.62$ ، $\frac{34}{21}\approx1.62$ ، $\frac{55}{34}\approx1.62$ ، $\frac{89}{55}\approx1.62$ ، $\frac{144}{89}\approx1.62$

3 ئەڤ رێژەنە یەکسانن بنێزیکی.

### چالاکی 2 : لاکێشەیا زێرین.

**کەرەستە و ئامیر:** بژمیر، راستە، پرگال.

**پێشینەیا بیرکاری:** دڤێت قوتابی بزانن چەوا شێوەیێن ئەندازەیی دروست بکەن.

**بەرسڤ**

1

2 $\frac{BC}{BF}=\frac{6}{3.71}\approx1.62$ ، $\frac{AF}{AD}=\frac{9.71}{6}\approx1.62$

3 هەردوو لاکێشە $AFGD$ و $BFGC$

4 بەرسڤا پێشبینکری

# بەرسڤێن پرۆژەی

بەشێ **7**

## پالەوانیا تایران

### چالاکی 1 : جالّجالوّکا زڤرۆك

**کەرەستە و ئامیر:** بژمێر.

**پێشینەیا بیرکاری:** دڤێت قوتابی بزانن چەوا درێژیا کڤانەکی لسەر بازنەکێ بهەژمێرن، هەکەر درێژیا نیڤتیرێ بازنێ و پیڤانا چەقە گۆشەیا ب کڤانەی هاتیە سنووردان بزانن.

**بەرسڤ**

**1** دەمێ $45^{o}$ بزڤرت، ئەو $\frac{1}{8}$ ێ خولەکی زڤرت ئانکو $\frac{\pi}{4}$ ، ژ ئەڤێ بۆ مە دیاردبیت کو ئەو دووراتیا تایری برێ دبیتە درێژیا کڤانەکی چەقە گۆشەیا وی $\frac{\pi}{4}$ رادیانە. ئەڤ درێژیا دبیتە $\frac{\pi}{4}$ پێ، چونکی نیڤتیرێ تایری ئێك پێیە.

**2**

**3**

**4** رێرەوێ جالجالۆکێ وەك نیڤ برگەیی ناتەواو [نیڤ هێك] یە دیاردبیت.

ناڤ ______________ بەروار ______________ هۆبە ______________

## بەرسڤێن پرۆژەی

بەشێ **7**

## پالەوانێ تایران.

### چالاکی 2 : یاسایا مۆری Morrie

**کەرەستە و ئامیر:** بژمێرا روونکرنێ.

**پێشینەیا بیرکاری:** دڤێت قوتابی بزانن چەوا بەهایێن رێژەیێن سێگۆشەیی بۆ گۆشەیەکێ بهەژمێرن بکارئینانا بژمێرەی.

و چەوا رێژەیێن سێگوشەی کورت دکەن بکارئینانا هاوئەنجامیت سیگوشەیی.

**بەرسڤ**

**1**

$(\cos 20^\circ) = 0.9\ 396\ 926\ 207\ 859$

$(\cos 40^\circ) = 0.766\ 044\ 443\ 119$

$(\cos 80^\circ) = 0.1736\ 481\ 776\ 669$

$(\cos 20^\circ)\ (c0s\ 40^\circ)\ (\cos 80^\circ) = 09\ 396\ 926\ 207\ 859 \text{ x } 0766\ 044\ 443\ 119 \text{ x } 01\ 736\ 491\ 776\ 669 = 0.125 = \frac{1}{8}$

**2**

$(\cos 30^\circ) = \frac{\sqrt{3}}{2}$ ، $(\cos 60^\circ) = \frac{1}{2}$ ، $(\cos 120^\circ) = -\frac{1}{2}$

$(\cos 30^\circ)(\cos 60^\circ)\ (\cos 120^\circ) = \frac{\sqrt{3}}{2} \times \frac{1}{2} \times \left(-\frac{1}{2}\right) = -\frac{\sqrt{3}}{2} \neq \frac{1}{12}$

پەیوەندیا $(\cos 120^\circ) = \frac{1}{12}$ $(\cos 60^\circ)$ $(\cos 30^\circ)$ نەیا دروستە.

**3**

هەکەر $a = 20^\circ$ دێ $\sin 8a = \sin a$ چونکی $\sin 160^\circ = \sin 20^\circ$ و ژ ئەڤێ بۆ مە دیاردبیت کو

$8(\cos a)(\cos 2a)(\cos 4a) = 8 \times \frac{1}{8} = 1 = \frac{\sin 8a}{\sin a}$

**4**

$$\frac{\sin 8a}{\sin a} = \frac{2\sin 4a \cos 4a}{\sin a} = \frac{2 \times 2 \sin 2a \cos 2a \cos 4a}{\sin a}$$
$$= \frac{2 \times 2 \times 2 \sin a \cos a \cos 2a \cos 4a}{\sin a}$$
$$= 8 \cos a \cos 2a \cos 4a$$